# چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەر ﷺ

- بەکوردی -

# صفة صلاة النبي ﷺ

((صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي))

صحيح البخاري (6008)


کۆکردنەوە وئامادەکردنی
محمد کریم علي
- بەردەڕەش -



- چاپی سێیەم -

ئەم کتێبە لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردنی ( 171 ) ساڵی ( 2021 )ـی پێدراوە



بۆ داواکردنی ئەم کتێبە بە شێوەی PDF تکایە پەیوەندی بەو ژمارە یان ئیمێڵەی خوارەوە بکە,
یان ئەم بارکۆدەی خوارەوە سکان بکە
هەر کەسێك بیەوێت بەپارە بەشداری بکات بۆ چاپکردنی ئەم کتێبە با پەیوەندی بەم ژمارەی خوارەوە بکات
هەر کەسێك هەڵەیەکی بینی لەم کتێبە تکایە ئاگادارمان بکاتەوە لەسەر ئەم ژمارەی خوارەوە,

ئیمێڵ : muhammadblackstone@gmail.com
ژمارەی مۆبایل : 07508121914
پەڕەی فەیس بووك : زانستی ڕاست العلم الصحيح
زانستی ڕاست zanstirast1439
کەناڵی تیلیگرام: https://t.me/zanstirast1439

چاپی سێیەم: 1000 دانە
تشرینی دووەم 2021
ربيع الثاني 1443



خوای گەورە جەزای خێری هەموو ئەو کەسانە بداتەوە کە بەشداربوون لە پێداچوونەوە و بەچاپ گەیاندنی ئەم کتێبە

بۆچی گرنگە فێری چۆنیەتی ئەنجامدانی نوێژ ببین:

1. نوێژ دووەم بناغەیە لە بناغەکانی ئیسلام:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: دینی ئیسلام لەسەر پێنج بناغە ئاوەدان کراوە: شایەدهێنان بە لا إله إلا الله وە محمد رسول الله, نوێژکردن, دەرکردنی زەکات, بە ڕۆژوو بوونی مانگی ڕەمەزان, حەجکردنی ماڵی خودا)) صحيح البخاري (8)

2. خوای گەورە لە چەندین شوێن لە قورئانی پیرۆز فەرمانی پێمان کردووە کەوا نوێژ ئەنجام بدەین: خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ سورة النور (56)

3. خوای گەورە لە قورئاندا چۆنییەتی نوێژی بۆمان دیاری نەکردووە بەڵام فەرمانی کردووە کە گوێڕایەڵ بین بۆ فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا﴾ سورة الحشر (7)

﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ (3) إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ(4) ﴾ سورة النجم (3-4)

4. پێغەمبەر ﷺ لە چەندین فەرموودەدا چۆنیەتی ئەنجامدانی نوێژەکانی فێری صەحابەکان کردووە

وە صەحابەکانیش بۆ ئێمەیان گواستۆتەوە. صحيح البخاري (757 - 377)

5. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: ( صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي ) صحيح البخاري (6008)

بەو شێوازە نوێژ ئەنجام بدەن کە منتان بینیوە لە ئەنجامدانی نوێژ.

6. وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:

((کەسانێك هەن 60 ساڵ نوێژ دەکەن, هیچ نوێژێکیان لێ قبول ناکرێت, لەوانەیە رکوع جوان و ڕێك ئەنجام بدەن بەڵام سوجدە بردنیان تەواو نیە, یان سوجدەیان ڕێك وجوانە بەڵام رکوعیان تەواو نیە)) صحيح الترغيب والترهيب (529)

لەبەر ئەو هۆکارانە و چەندین هۆکاری دیکە پێویستە خۆمان فێری چۆنییەتی نوێژی پێغەمبەر ﷺ بکەین. وە هەروەها ماڵ و منداڵەکانیشمان فێری نوێژ بکەین.

**1.** فێربوونی نوێژ تەنها بۆ منداڵان نیە, بەڵكو هەموو موسڵمانێك چ گەورە بێت یان بچووك, چ پیاو بێت یان ئافرەت پێویستە خۆی فێرە چۆنیەتی نوێژی پێغەمبەر ﷺ بكات وە بەردەوام چاودێری وپێداچوونەوە بۆ نوێژەكەی بكات.

**2.** هیچ جیاوازییەك نیە لە نێوان نوێژكردنی پیاوان وئافرەتان وە پێویستە ئافرەتانیش نوێژ بەو شێوەیە ئەنجام بدەن كە پیاوان ئەنجامی دەدەن لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: ((إنما النِّساءُ شقائقُ الرِّجالِ)) الصحيحة (2863) واتا ئافرەتان هاوتا (شقائق) پیاوانن لە هەموو ئەحكام و واجباتەكان. تەنها لەو شتانە ئافرەت جیاوازن كە خوای گەورە تایبەتی كردووە بۆ ئافرەت, وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: (صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي) صحيح البخاري (6008) بەو شێوازە نوێژ ئەنجام بدەن كە منتان بینیوە لە ئەنجامدانی نوێژ, ئەو فەرمانەی پێغەمبەر ﷺ گشتییە بۆ پیاو و ئافرەت. وە لە نوێژدا هیچ شتێك تایبەت نەكراوە بە ئافرەت بۆیە نوێژەكەی وەكو نوێژی پیاو دەبێت. وە هەر كەسێك بڵێت نوێژی ئافرەت جیاوازی هەیە لەگەڵ نوێژی پیاو ئەوا پێویستە بەڵگە بهێنێتەوە بۆ قسەكەی! بەڵام هیچ بەڵگەیەك نیە.

**3.** ئەم نامیلكەیە لە چەندین كتێب دەرهێنراوە و كۆكراوەتەوە بە تایبەتی كتێبی (صفة صلاة النبي ﷺ) نووسینی پێشەوای فەرموودەناس محمد ناصرالدین ئەلبانی -رحمه الله- كە كتێبێكی زۆر بەسوودە لە چۆنیەتی ئەنجامدانی نوێژ بەو شێوەیەی كە پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی داوە وە هەروەهـــــا (صفة صلاة النبي ﷺ)ی شێخ محمد صالح العثيمين -رحمه الله-. بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی نوێژ و زانینی سەرچاوەكان, بگەڕێوە سەر ئەم كتێبانە و سەرچاوە فقهییەكان.

**4.** هەموو ئەو بابەت و زیكر و دوعایانەی لەم نامیلكەیە هاتووە بەڵگەی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی صحیحی پێغەمبەر ﷺ و كردەوە و ووتەی صەحابەكانی لەسەرە. بەڵام لە زۆرینەی شوێنەكان لەم نامیلكەیە ئاماژە نەكراوە بە سەرچاوەكان بۆ ئەوەی بابەتەكان تێكەڵاو نەبێت وە خوێنەر سەری لێ نەشێوێت.

**مەرجەکانی نوێژ:** بریتین لەو شتانەی کەوا پێویستە پێش ئەوەی دەست بە نوێژ بکەیت بێتەجێ بۆ ئەوەی بتوانی نوێژ ئەنجام بدەیت:

- هاتنی کاتی نوێژ (دخول الوقت)؛
- خۆ شووشتن بۆ ئەو کەسەی کە تووشی لەش گرانی (جنابة) بووە؛
- هەڵگرتنی دەستنوێژ بە شێوەیەکی ڕێك و جوان؛
- داپۆشینی لاشە بە جلێکی شەرعی؛
- پێویستە پیاو لە ناوکی تاکو سەرچۆکی دا بپۆشێت وە پۆشاکێکیش بەسەر شانی دابدات؛
- پێویستە ئافرەت هەموو لاشەی داپۆشێت لە نوێژدا تەنها هەردوو دەستی نەبێت لەگەڵ دەم وچاوی, وە جل وبەرگی ئافرەت پێویستە تەسك نەبێت بەڵکو بەرین بێت وە بە لاشەی نەنووسێت بەشێوەیەك کە وەسفی لاشەی بکات؛
- پاککردنەوەی لاشە لە هەموو شتێکی پیس و بێ نوێژ؛
- پاککردنەوەی جل و بەرگ لە هەموو شتێکی پیس و بێ نوێژ؛
- پاککردنەوەی جێگای نوێژکردن لە هەموو شتێکی پیس و بێ نوێژ؛
- ڕاوەستان ڕوو بەرەو قیبلە؛
- **هەبوونی نیەت:** پێش ئەوەی دەست بکەیت بە نوێژکردن پێویستە نیەتی نوێژکردن لەدڵی خۆتدا بهێنی (نیەت جێگای دڵە وە دروست نیە بە زمان بووترێت)

- دانانی بەربەست (السترە) بابەتێکی گرنگە کە بەشێکی زۆر موسڵمانان گرنگی پێ نادەن؛
- بەشێك لە زانایان پێیان وایە کە بەربەست دانان واجبە پێش ئەوەی دەست بە نوێژ بکەیت وە بەشێکی زۆری زانایان پێیان وایە سونەتە، بۆیە پێویستە گرنگییەکی تایبەت بە دانانی بەربەست بدەین چونکە بەلایەنی کەم سونەتێکی مؤکدة کە زۆر جەختی لەسەر کراوەتەوە لەلایەن پێغەمبەر ﷺ.
  - پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: نوێژ نەکەیت مەگەر بەربەست (السترە) لە پێشت نەبێت؛
  - پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: هەر کاتێك نوێژتان کرد ئەوا بەربەست (السترە) دابنێت وە خۆتان لەو بەربەستە نزیك بکەنەوە.
  - لەهەر شوێنێك نوێژ ئەنجام بدەیت بەربەست دابنێ چ لەناو ماڵ بیت چ لە مزگەوت بیت چ لە دەرەوەی شار بیت شوێنەکە چۆڵەوانی بێت یان خەڵکی لێبێت....هتد. لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە بە بەربەست دانان لە هەموو نوێژێکدا وە هەروەها کە پێغەمبەر ﷺ بەربەستی لە پێش خۆی داناوە لەو کاتەی لە چۆڵەوانی ودەشتدا نوێژی ئەنجامداوە. وەدانانی سوترە پەیوەندی بەوە نیە کەس بەو شوێنە دێت یاخود نا.
  - هەرشتێکی خاوێنی بەرزت بینیەوە بیکە بە بەربەرست چ دیواربێت چ داربێت چ کەسێك بێت کە دانیشتووە چ مێز بێت.....هتد، لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ هەندێك جار شمشێرە بچووکەکەی بەرپشتی کردۆتە بەربەست هەندێك جار ئەو ئاژەڵەی کە بۆ سەفەر بەکاری هێناوە کردوویەتی بە بەربەرست بۆ نوێژەکەی؛
  - پێویستە بەربەستی نوێژ لە بستێك نزم تر نەبێت وە نێوان شوێنی سوجدە و بەربەست مەودای پێدا ڕۆیشتنی مەڕێك-بزنێك بێت؛
  - هێڵ -خط- بۆ بەربەست نابێت بەڵکو دەبێت شتێکی بەرز بێت لە زەوی.
  - نابێت ڕێگە بدەیت هیچ کەس لە نێوان خۆت و بەربەستەکەت تێپەڕبێت.



**روکن یان بناغە :** هەر کردەوەیەك کە روکن و بناغەی نوێژ بێت وە ئە نجامی نەدەیت ئەوا ئەو نوێژە بەتاڵ دەبێت جا چ بە ئەنقەست بێت یان لە بیرت بچێت.

**بناغەو روکنەکانی نوێژ:**

- ڕاوەستان بە پێوە لە نوێژی فەرز بۆ ئەو کەسەی کە بتوانێت؛
- تەکبیرەی چوونە ناو نوێژ ( تكبيرة الإحرام ) بە ووتنی الله أكبر؛
- خوێندنی سورەتی ( الفاتحة ) لە هەموو رکاعەتێکدا ؛
- رکوع بردن بەشێوەیەکی ڕێك و جێگیربوون وە عەجەلە نەکردن تێیدا ؛
- هەڵستانەوە لە رکوع و ڕاست بوونەوە بەشێوەیەك هەموو ئێسکەکان بگەڕێنەوە شوێنی خۆی؛
- سوجدە بردن بەشێوەیەکی ڕێك و جێگیربوون وە عەجەلە نەکردن تێیدا ؛
- هەستانەوە لە سوجدە و دانیشتن لە نێوان هەردوو سوجدەدا بەشێوەیەکی جێگیر؛
- دانیشتن بۆ تەحیاتی کۆتایی خوێندنی تەحیاتی کۆتایی؛
- جێگیربوون بەشێوەیەکی ئارام وعەجەلە نەکردن لە هەموو ئەو کردەوانەی سەرەوە؛
- سەلام دانەوە بۆ لای ڕاست.

ئەو ڕوکنانە پێویستە یەك لەدوای یەکدا ئە نجام بدرێت نابێت پاش و پێش تێیاندا بکرێت

**واجب :** هەر کردەوەیەك واجب بێت لە نوێژ, ئەگەر لەبیرت بچێت و ئە نجامی نەدەیت ئەوا نوێژت بەتاڵ نابێت بەڵام کە بیرت کەوتەوە واجبە دوو سوجدەی سەهو ببەیت. بەڵام ئەگەر بە ئەنقەست واجب ئە نجام نەدەیت ئەوا نوێژەکەت بەتاڵ دەبێت.

**واجبەکانی نوێژ:**

- ووتنی الله أكبر لە کاتی گواستنەوە لە نێوان روکنەکان؛
- ووتنی ( سمع الله لمن حمده ) لە ڕێگای ڕاست بوونەوە دوای رکوع؛
- ووتنی ( ربنا ولك الحمد ) لەکاتی ڕاستبوونەوەی دوای رکوع؛
- ووتنی ( سبحان ربي العظيم ) یەکجار لە رکوعدا یان هەر زکرێك لە رکوعدا هاتووە؛
- ووتنی ( سبحان ربي الأعلى ) یەکجار لە سوجدەدا یان هەر زکرێك لە سوجدەدا هاتووە؛
- دانیشتن بۆ تەحیاتی ناوەڕاست بۆ ئەو نوێژانەی زیاتر لە یەك تەحیاتی تێدایە وەکو نوێژی نیوەڕۆ وعەسر و مەغریب و عیشا.

**سونەت :** هەر کردەوەیەك سونەت بێت لە نوێژ, ئەوا ئەگەر ئە نجامی بدەیت خێر وپاداشتت بۆ دەنووسرێت بەڵام ئەگەر ئە نجامی نەدەیت ئەوا هیچ کاریگەری لەسەر دروستی نوێژەکەت نیە واتا نوێژەکەت بەتاڵ نابێتەوە. هەندێك لە سونەتەکان : دوعای دەسپێکی نوێژ, ووتنی زیکرەکانی رکوع و سوجدە زیاتر لە جارێك, بەرزکردنەوەی هەردوو دەست لەکاتی هەڵستانەوەکان..هتد.

1. پێویستە هەموو موسڵمانێك بزانێت کەوا هەر کەسێك شەریك بۆ خوای گەورە بڕیار بدات ئەوا نە نوێژ نە هیچ عیبادەتێکی دیکەی لێ قبول ناکرێت, بۆیە پێویستە هەموومان تەنها خوای گەورە بپەرستین وە هیچ جۆرە عیبادەتێك بۆ هیچ شتێکی دیکە ئەنجام نەدەین جگە لە خوای گەورە. جا ئەو عیبادەتە داواکردن و دوعاکردن بێت یان نوێژ بێت یان ڕۆژوو گرتن بێت یان سەربڕین بێت یان پشت بەستن بێت یان داوای بە هاناوە چوون و شیفای نەخۆش بێت یان هەر جۆرە عیبادەتێکی دیکە بێت.

خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿ وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا ﴾ سورة النساء ( 36 )

2. پێویستە لە هەموو ڕوکنەکانی نوێژدا بە جوانی جێگیر بیت وە عەجەلەی تێدا نەکەی تاکو هەموو ئێسکەکان شوێنی خۆیان دەگرن. ئەگەر عەجەلەی تێدا بکەی وە جێگیرنەبیت ئەوا نوێژت بەتاڵ دەبێتەوە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: (( يـا معشرَ المسلِمينَ لا صلاةَ لمن لا يقيمُ صلبَهُ في الرُّكوعِ والسُّجود )) صحيح ابن ماجه ( 718 )

3. پێویستە هەوڵی تەواو بدەیت بۆ ئەوەی بیرت لە لای نوێژەکەت بێت بزانیت چ جووڵەیەك دەکەی وە چی دەڵێی وە بیرت نەڕوات بەرەو شتی دیکە, لەبەر ئەوەی ئەوەندە خێر و پاداشتت بۆ دەنووسرێت بەقەدەر ئەوەندەی کە بیرت لای نوێژەکەتە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: (( إنَّ الرَّجلَ لينصرِفُ، وما كُتِبَ لَه إلَّا عُشرُ صلاتِه تُسعُها ثمنُها سُبعُها سُدسُها خُمسُها رُبعُها ثُلثُها ، نِصفُها )) حديث حسن صحيح أبي داود ( 796 )

4. خوای گەورە دەفەرموویێت: ﴿إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ﴾ العنكبوت ( 45 )

واتا - نوێژ لە خراپە و تاوان دوورت دەکاتەوە -

بەڵام دەبینین خەڵکانێك نوێژیش دەکەن بەڵام هەر خەریکی خراپە و تاوانن, یەکێك لە هۆکارەکانی ئەوەیە کەوا گرنگی بە چۆنییەتی ئەنجامدانی نوێژ نادەن وە بیریان لای نوێژەکان نیە وە نوێژ بە ڕێك و جوانی ئەنجام نادەن. بۆیە پێویستە گرنگی بە نوێژ بدەین بۆ ئەوەی ببێتە هۆکارێك بۆ دوورکەوتنەوە لە خراپە و تاوان.

ئەو کەسەی توانای هەبێت, روکنە لە نوێژە فەرزەکان بە ڕاوەستان نوێژ ئەنجام بدات؛

- هەموو لاشەت بەرەو قیبلە بێت؛
- چاوەکانت بەرەو شوێنی سوجدە بێت تاکو کۆتایی نوێژ تەنها لە ( تشهد ) نەبێت؛
- پێیەکانت بەقەدەر شانەکانت لێك دوور بکەوە؛



**تێبینی :** ئەو کەسەی توانای هەبێت, ئەوا پێویستە نوێژە فەرزەکان بە ڕاوەستان ئەنجام بدات, بەلام ئەگەر توانای نەبوو ( لاواز بوو, نەخۆش بوو...هتد ) ئەوە بە دانیشتن نوێژەکەی ئەنجام دەدات ئەگەر هەر توانای نەبوو ئەوا لەسەر تەنیشت نوێژەکەی ئەنجام دەدات, یان بە هەرشێوەیەك کە بتوانێت وە بەگوێرەی توانا بتوانێت زۆرترین کردەوەکانی نوێژ وەکو خۆی ئەنجام بدات وە ئەجر وپاداشتی تەواوی بۆ دەنووسرێت. بەلام نوێژی سونەت, هەموو کەس بۆی هەیە بە دانیشتن ئەنجامی بدات تەنانەت ئەگەر تواناشی هەبوو بەلام نیوەی پاداشتی بۆ دەنووسرێت. وە دروستە موسڵمان نوێژی سونەت لەسەر پشتی سوار و لەناو ئۆتۆمبێل و فرۆکە و هتد ئەنجام بدات. نمونە سونەتی چێشتان ( ضحى ) و نوێژی ویتر و ...هتد.

## شێوازە هەڵەکان لە کاتی وەستاندا

| | | |
|---|---|---|
| زۆر کردنەوەی پێیەکان | زۆر پێکەوە لکاندنی پێیەکان | چاو بردن بۆ ئاسمان و شوێنی دیکە |







# چوونە ناو نوێژ بە ووتنی (اللّٰه أكبر)

ووتنی ( اللّٰه أكبر ) بۆ چوونە ناو نوێژ روكنە

- بەو تەكبیرەیە دەچیتە ناو نوێژ و هەموو شتی دونیاییت لێ حەرام دەبێت بۆیە پێ ی دەووترێت ( تكبيرة الإحرام )
- هەر كەسێك ( اللّٰه أكبر ) نەڵێت ئەوا نوێژەكەی بەتاڵە جا چ لە بیری چووبێت یان بە ئەنقەست نەیڵێت.





- پێش ووتنی ( اللّٰه أكبر ) یان لەگەڵ ووتنی ( اللّٰه أكبر ) یان دوای ووتنی ( اللّٰه أكبر ) سونەتە دەستەكانت بەرز بكەیتەوە تاكو سەری پا نجەكانی دەستت دەگاتە بەرامبەر هەردوو شانت ؛
- یان دەستەكانت بەرز بكەرەوە تاكو سەری پە نجەكانت دەگاتە بەرامبەر بەشی سەرەوەی گوێیەكانت.

پە نجەی دەستەكانت زۆر بەیەكەوە نەلكێنە وە زۆریش لێكیان جیا نەكەوە ؛ وە رووی ناوەوەی دەستەكانت بەرەوە قیبلە بێت ؛

## شێوازە هەڵەكان لە كاتی دەست بەرزكردنەوە

زۆر بەرزكردنەوەی دەستەكان





كەم بەرز كردنەوەی دەستەكان





دەستەكان ببرێنە پشت گوێ





- دانانی دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ
- وە دانانی هەردووکیان لەسەر سینگ



دەستی ڕاست لەسەر دەستی چەپ
هەردووکیان لەسەر سینگ

- تەنها لە ڕکاعەتی یەکەم سونەتە دوعای دەستپێکردنی نوێژ بخوێنیت: ئەو دوعایە زۆر جۆری هەیە, موسڵمان دەتوانێت یەکێکیان هەڵبژێرێت:

**پێغەمبەر ﷺ ئەو دوعایەی لە دەستپێکی نوێژە فەرزەکان دەخوێند:**

﴿اللَّهمَّ باعِدْ بيني وبين خطاياي، كما باعدتَ بين المشرقِ والمغرب. اللَّهمَّ نقِّني من خطايايَ ، كما يُنقَّى الثَّوبُ الأبيَضُ من الدَّنسِ. اللَّهمَّ اغسِلْني من خطايايَ بالثَّلجِ، والماءِ ، والبَرَدِ﴾

یان هەر دوعایەکی دیکە کە لە سونەتی پێغەمبەر ﷺ هاتووە وەکو:

﴿سبحانَكَ اللهمَّ وبحمدِكَ وتبارَكَ اسمُكَ وتعالَى جدُّكَ ولا إلهَ غيرُك﴾

یان

﴿اللهُ أكْبَرْ كَبيراً, والحَمْدُلله كثيراً, وسُبْحانَ اللهِ بُكْرَةً وأصيلا﴾

یان

﴿الحَمْدُللهِ حَمْداً كثيراً طيباً مباركاً فيه﴾



جۆرەکانی دەست دانان

## شێوازە هەڵەکان لە کاتی دانانی دەست

زۆر بەرزکردنەوەی دەستەکان



کەم بەرز کردنەوەی دەستەکان



گرتنی دەستەکان بە شێوەی هەڵە





- پێش دەستپێکردنی خوێندنەوەی قورئان سونەتە یەکێك لەمانە بڵێ ی:

﴿أعوذ بالله من الشيطان الرجيم﴾

﴿أعوذ بالله من الشيطان الرجيم من همزه ونفخه ونفثه﴾

پاشان

- خوێندنەوەی سورەتی الفاتحة
- خوێندنی سورەتی الفاتحة لە هەموو رکاعەتێکدا روکنە
- لەهەر رکاعەتێك نەیخوێنێت جا چ لە بیرت بچێت یان بە ئەنقەست نەیخوێنێت ئەوا ئەو رکاعەتەت حیساب نیە و بەتاڵە.
- ئەگەر لە نوێژی بە کۆمەڵ (جەماعەت)یش بێت هەر دەبێت سورەتی الفاتحة بخوێنێت؛

- وە ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾ ئایەتێکە لە سورەتی الفاتحة بۆیە پێویستە لە هەموو رکاعەتێکدا لە سەرەتای سورەتی الفاتحة بیخوێنێت؛
- سونەتە سورەتی (الفاتحة) ئایەت ئایەت بخوێنیتەوە واتا لەکۆتایی هەموو ئایەتەکان ڕابوەستیت هەروەکو پێغەمبەر ﷺ بەو شێوەیە دەیخوێند.

أعوذ بالله من الشيطان الرجيم

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴿1﴾

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴿2﴾ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴿3﴾

مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴿4﴾إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴿5﴾

ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ﴿6﴾صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ

غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴿7﴾

[سورة الفاتحة]

- لەدوای خوێندنەوەی سورەتی الفاتحة سونەتە بڵێ ی ﴿ئامين﴾
ئامین واتا خوایە ئەو دوعایانەمان لێ وەربگرە وقبولی بکە؛
- پاشان بە پێ ی توانا سونەتە هەندێك قورئان بخوێنێت.



- پاشان سونەتە دەستەکانت بەرزبکەیتەوە بەهەمان شێوەی یەکەم خۆت بچەمێنەوە بەرەو ڕکوع؛
  - لە کاتی خۆ چەماندنەوە بۆ ڕکوع, واجبە بڵێیت ﴿الله أكبر﴾؛




- ڕکوع ڕوکن و بناغەیە لە هەموو ڕکاعەتێکدا
  - دەبێت لە ڕکوعدا پشتت ڕاست بێت وە سەرت لە ئاستی پشتت بێت وە بە تەواوی جێگیر ببی هەتا هەموو ئێسکەکان جێگای خۆیان دەگرن و بێ ئەوەی عەجەلەی تێدا بکەی؛
  - پە نجەی دەستەکانت بڵاوبکەوە وە بە ناو لەپی هەردوودەستت چۆکەکانت توند بگرە
  - هەندێك لەو زیکرانەی کە واجبە یەکێکیان لە ڕکوعدا بخوێنرێت:

﴿سبحان ربي العظيم وبحمده﴾

یان: ﴿سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا، وبِحَمْدِكَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي﴾

یان هەر زیکرێك کە لە سونەتی پێغەمبەر ﷺ هاتبێت.




- نابێت قورئان لە ڕکوعدا بخوێندرێت.

## شێوازە هەڵەکان لە کاتی ڕکوعدا

| زۆر چەماندنەوەی پشت | کەم چەماندنەوەی پشت | گرتنی چۆکەکان بە شێوەی هەڵە |
|---|---|---|
|  |  |  |



پاشان بەرز دەبێتەوە لە ڕکوع وە لەڕێگای ڕاستبوونەوە واجبە بڵێیت:

﴿سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهْ﴾




- کە بە تەواوی ڕاستبوویەوە و هەموو ئێسکەکانت گەڕانەوە شوێنی خۆی ئەوا وەکو جاری یەکەم دەستەکانت بەرز دەکەیتەوە و واجبە بڵێیت:

﴿رَبَّنَا لَكَ الحَمْدْ﴾ یان ﴿رَبَّنَا ولَكَ الحَمْدْ﴾

- پاشان پێویستە بە تەواوی جێگیر بیت و بێ ئەوەی عەجەلەی تێدا بکەی
- سونەتە ئەو زیکرەش زیاد بکەیت لە کاتی ئەو ڕاوەستانە

﴿حمداً كثيراً طيباً مباركاً فيه﴾




**تێبینییەکی گرنگ:** پێویستە کەسی پێشنوێژ (إمام) و ئەو کەسەی نوێژ لەدوای إمام دەکات (مأموم) لە نوێژی بەکۆمەڵ (جماعة) و ئەو کەسەی نوێژ بە تەنها دەکات هەردوو زیکری سەرەوە:

﴿سَمِعَ اللّهُ لِمَنْ حَمِدَهْ﴾

و ﴿رَبَّنَا لَكَ الحَمْدْ﴾ بڵێن؛

**شێوازە هەڵەکان لە کاتی دەست بەرزکردنەوەی دوای ڕکوع**

| زۆر بەرزکردنەوەی دەستەکان | کەم بەرز کردنەوەی دەستەکان | ڕووی دەستەکان بەرەو دەم وچاو |
|---|---|---|
|  |  |  |



پاشان بەرەو سوجدە بردن خۆت نزم دەکەیتەوە

- لەڕێگەی چوون بۆ سوجدە واجبە بلێیت ﴿الله أكبر﴾؛
- هەردوو دەستەکانت پێش بخە و لە لاشەت دووربکەرەوە؛
- دەستەکانت بگەینە زەوی پێش چۆکەکانت؛
- لەبەر ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردووە هەردوو دەستەکا نمان بگەیێنینە زەوی پێش هەردوو چۆکمان؛
- بە هێواشی دابەزە بەرەو زەوی خۆت بە توندی مەخەرە سەرە زەوی.



- **سوجدە بردن ڕوکنە لە هەموو رکاعەتێکدا؛**
- **پێویستە لەسەر 7 ئێسکی لاشەت سوجدە بەیت:**

1. نێو چەوان و لووت (دەبێت لووتت باش لەسەر زەوی جێگیر بێت)
2. هەردوو دەست (پەنجەکان بەیەکەوە بنووسێنە و بەرەو قیبلە بێت) وە سەری پەنجەکانی دەستت بەرامبەر هەردوو شان یان بەرامبەر بەشی سەرەوەی گوێیەکانت دادەنێیت؛
3. هەردوو چۆکی پێت (باش لەزەوی جێگیریان بکە)
4. هەردوو پێ (بەیەکەوە بیان لکێنە و باش لە زەوی بیان چەقێنە بە شێوەیەك نەرمە گۆشتی بنە پێ کە لەدوای پەنجەکان دێت بگاتە زەوی و پەنجەکان بەرەو قیبلە بن).

- بە تەواوی جێگیر ببە هەتا هەموو ئێسکەکان جێگای خۆیان دەگرن و بێ ئەوەی عەجەلەی تێدا بکەی؛
- دەبێت باسك و ئەنیشکی دەستت لەسەر زەوی ڕانەخەی و لە هەردوو تەنیشتەکانت دووربکەیتەوە؛
- هەندێك لەو زیکرانەی کە واجبە یەکێکیان لە سوجدەدا بخوێنرێت:

﴿سبحان ربي الأعلى وبحمده﴾

یان ﴿سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ رَبَّنَا وبِحَمْدِكَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لي﴾

یان هەر زیکرێك کە لە سوونەتی پێغەمبەر ﷺ هاتبێت.

دەستەکانت ڕوو بەرەو قیبلە وە سەری پەنجەکانی دەستت بەرامبەر هەردوو شان یان بەرامبەر بەشی سەرەوەی گوێیەکانت دادەنێیت





بەرزکردنەوەی باسك و ئەنیشك و دوورخستنەوەیان لە لاشە



- نابێت قورئان لە سوجدەدا بخوێندرێت؛
- سونەتە زۆر دوعا لە سوجدەدا بکرێت لەبەر ئەوەی مرۆڤ لە سوجدەدا لە هەموو کاتێکی دیکە نزیکترە لە خوای گەورە و سوجدە یەکێکە لەو کاتانەی کە خوای گەورە تێیدا دوعا قبول دەکات.
- دروستە دوعاکردن بە کوردی بۆ کەسێك کە عەرەبی نەزانێت.







نابێت سوجدە لەسەر شتی بڵند ببرێت, وە هەر کەسێك نەتوانێت سوجدە ببات ئەوا پێویست ناکات شتێکی بڵند لە ژێر نیوچەوانی دابنێت بەڵکو تەنها سەری خۆی نزم دەکات بەقەدەر ئەوەندەی لە توانای دایە, لەبەر ئەوەی **پێغەمبەر ﷺ نەهی کردووە لە ئافرەتێك کە لەسەر بالیفێك نوێژی ئەنجام دەدا وە شوێنی سوجدەی خۆی بەرزکردبووە!**

## شێوازە هەڵەکان لە کاتی سوجدەدا

دانەنانی لووت لەسەر زەوی و بەرزکردنەوەی وجێگیر نەکردنی



ڕاخستنی باسك و ئەنیشك لەسەر زەوی



بەرزکردنەوەی پێیەکان وجێگیر نەکردنی لەسەر زەوی



لێك جیاکردنەوە و دوورخستنەوە و نە چەقاندنی پێیەکان



# دانیشتن لە نێوان هەردوو سوجدەدا

پاشان سەرت بەرز دەکەیتەوە بۆ دانیشتنی نێوان هەردوو سوجدەدا



- ئەو دانیشتنە روکنە؛
- لەرێگەی چوون بۆ ئەو دانیشتنە واجبە بلێیت ﴿الله أكبر﴾؛ تاکو دەگەیتە شێوەی دانیشتن و هەموو ئێسکەکانت دەگەرێتەوە جێگای خۆی؛ وە پێویستە جێگیر بیت لەو دانیشتنەت بێ ئەوەی عەجەلەی تێدا بکەی
- هەردوو دەستت لەسەر رانت وە سەری پەنجەکانت لەسەر چۆکت دادەنێیت؛
- پێ ی راستت لە زەوی بچەقێنە و پێی چەپیش لەسەر زەوی را بخە ولەسەری دابنیشە؛




- وە هەندێك جاریش سونەتە هەردوو پێیەکان بچەقێنیت لە زەوی و لەسەریان دابنیشی کە پێی دەووترێت (الإقعاء)؛
- ئەو زیکرانەش لەو دانیشتنە دەخوێندرێت:

﴿اللهم اغفر لي وارحمني, واجبرني, وارفعني, واهدني, وعافني, وارزقني﴾

یان دووبارە کردنەوەی ﴿ربِّ اغفر لي, ربِّ اغفر لي﴾

**تێبینی:** هەندێك زانا پێیان وایە خوێندنی یەکێك لەو دوو زیکرە واجبە.

## شێوازە هەڵەکان دانیشتنی نێوان هەردوو سوجدە

خستنە سەر یەکی پێیەکان



دوورخستنەوەی پێیەکان و دانیشتن لەسەر ڕان




سوجدەی دووەم

- پاشان نزم دەبیتەوە بەرەو سوجدەی دووەم
- لەڕێگەی چوون بۆ سوجدەی دووەم واجبە بڵێیت:

﴿اللَّه أكبر﴾؛

- سوجدەی دووەم ئەنجام دەدەی بەو شێوەی کە لە لاپەڕەی سوجدە بردن -نوێژ 8 و 9- باسکرا.


جلسة الإستراحة

- پاشان پێش ئەوەی هەڵبستیتەوە بۆ ڕکاعەتی دووەم، سونەتە دانیشتنێکی سووك و ماوە کەم ( جلسة الإستراحة ) بکەیت کە هەمان شێوەی دانیشتنی نێوان هەردوو سوجدەی هەیە بەڵام ماوەی کورتە؛



هەستانەوە بە پشتن بەستن لەسەر دەستەکان بەرزکردنەوەی چۆك پێش دەست

- پاشان لەسەر هەردوو دەستەکانت ( لە شێوەی هەویر شێلان ) هەڵدەستیتەوە بۆ ڕکاعەتی دووەم، چۆکەکانت بەرز دەکەیتەوە پێش دەستەکانت؛
- لەکاتی هەڵسانەوەت لە سوجدەی دووەم و چوونت بۆ ڕکاعەتی دووەم واجبە بڵێیت ﴿اللَّه أكبر﴾؛


ئەنجامدانی ڕکاعەتی دووەم

- پاشان هەموو ئەو کردەوانەی کە باسکرا لە ڕکاعەتی یەکەم ئەنجام دەدەیت.

# دانیشتنی تەحیات



که له سوجدەی دووەمی رکاعەتی دووەم تەواو بووی,
ئەوا هەڵدەستیتەوە بۆ دانیشتنی تەحیات

- ئەگەر نوێژەکە یەك تەحیاتی هەبوو ئەوا دانیشتن بۆ تەحیات و ووتنی تەحیات ڕوکنە وەکو نوێژی بەیانی و جومعە و هەردوو جەژن, بەڵام ئەگەر نوێژەکە دوو تەحیاتی هەبوو ئەوا تەحیاتی یەکەم واجبە وتەحیاتی دووەم ڕوکنە وەکو نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشا )



- له ڕێگای چوونت بۆ تەحیات واجبە بڵێیت ﴿الله أكبر﴾؛
- له دانیشتنی تەحیاتدا پێویستە بە شێوەیەك دابنیشیت کە هەموو ئێسکەکانت جێگای خۆی ی بگرێت و جێگیر بێت؛
- پـێ ی ڕاستت له زەوی بچەقێنە و پێی چەپیش لەسەر زەوی ڕا بخە ولەسەری دانیشە؛



- دەستی چەپت لەسەر ڕانی چەپت دابنێ و پەنجەکانی دەستی ڕاستت کۆ بکەوە تەنها پەنجەی دوای پەنجەگەورەکە بەرزبکەرەوە بەشێوەیەکی ڕاست و ڕوو له قیبلە؛
- دەبێت چاوەکانت بڕوانێتە ئەو پەنجەیەی کە بەرزکراوەتەوە؛
- جوڵاندنی ئەو پەنجەی کە بەرزکراوەتەوە سونەتە.

- ئەگەر نوێژەکە دوو تەحیاتی تێدا بوو (وەکو نوێژی نیوەڕۆ و عەسر و مەغریب و عیشا) ئەوا سونەتە له تەحیاتی دووەم پێی ڕاستت له زەوی بچەقێنی وە پێی چەپت له ژێر پـێ ی ڕاستت دەربهێنی (ئەو جۆرە دانیشتنە پـێ ی دەگوترێت (التورك))؛



دانیشتن بە شێوەی (التورك)

- پاشان تەحیات دەخوێنیت؛
- پاشان واجبە صەلاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ بدەی؛
- پاشان هەر دوعایەك کە بتەوێت بیکەی. دروستە دوعاکردن بە کوردی بۆ کەسێك عەرەبی نەزانێت.

# شێوازە هەڵەکان لە دانیشتنی تەحیات

داناني پێیەکان بە شێوەیەکی هەڵە



چاوەکان ڕوو لە نینۆکی پەنجە بەرزکراوەکەی دەستی ڕاست نەبن



زۆر گەڕانەوەی دەست بۆ دواوە



نەگرتنی پەنجەکان بە شێوەیەکی دروست



شێوازی تەحیات خوێندن: ئەمە شێوازێکە لە شێوازەکان وە چەندین شێوازی دیکەشی هەیە

1. ﴿التحياتُ لله والصلواتُ والطَّيِّباتُ السلام على النبي ورحمة الله وبركاته
السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله﴾

یان 2. ﴿التحياتُ لله والصلواتُ والطَّيِّباتُ السلام عليك أيها النبي ورحمة الله وبركاته
السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمدا عبده ورسوله﴾

پاشان صەلاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ واجبە,

﴿اللَّهُمَّ صَلِّ عَلى مُحَمَّد وعلَى آلِ مُحَمَّد، كما صَلَّيْتَ على إبْراهِيمَ،
وعلَى آلِ إبْراهِيمَ، إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ،
اللَّهُمَّ بَارِكْ علَى مُحَمَّد وعلَى آلِ مُحَمَّد، كما بَارَكْتَ علَى إبْرَاهِيمَ،
وعلَى آلِ إبْرَاهِيمَ إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ﴾

صەلاوات تایبەت نیە تەنها بە تەحیاتی کۆتایی, بەڵکو لە تەحیاتی ناوەڕاستیش صەلاوات لەدوای تەحیات دەخوێندرێت

ئەگەر تەحیاتی کۆتایی بوو ئەوا ئەو دوعایەی خوارەوە بخوێنە بە تایبەت لە نوێژە فەرزەکان؛ هەندێك لە زانایان پێیان وایە واجبە ئەو دوعایە لە تەحیاتی کۆتایی بخوێندرێت:

﴿اللَّهُمَّ إنِّي أَعُوذُ بِكَ مِن عَذَابِ جَهَنَّم، وَمِنْ عَذَابِ القَبْرِ،
وَمِنْ فِتْنَةِ المَحْيَا وَالْمَمَاتِ، وَمِنْ شَرِّ فِتْنَةِ المَسِيحِ الدَّجَّالِ﴾

پاشان سونەتە هەر دوعایەك بکەیت, وەکو ئەو دوعایانەی کە لە سونەتی پێغەمبەر ﷺ هاتووە:

﴿اللهم إني ظلمت نفسي ظلما كثيرا ولا يغفر الذنوب إلا أنت
فاغفر لي مغفرة من عندك وارحمني إنك أنت الغفور الرحيم﴾
﴿اللهم حاسبني حساباً يسيراً﴾

سونەتە لە التحيات دوعا بکرێت, جا چ تەحیاتی یەکەم بێت یان تەحیاتی کۆتایی.

---

**تێبینییەکی زۆر گرنگ:**

ئەو هەردوو شێوازەی التحيات (السلام على النبي..) یان (السلام عليك أيها النبي..) هەرکامەی بڵێی دروستە:

1. عبدالله کوڕی مەسعود رضي الله عنه دەفەرموێت: لەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ لە ژیاندا بوو دەمان ووت (السلام عليك أيها النبي..), کە پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کرد دەمان ووت (السلام على النبي..) وە هەروەها عائشة رضي الله عنها تەحیاتی بەو شێوازەی فێرە خەڵك دەکرد (السلام على النبي..).

2. عمر کوڕی خطاب رضي الله عنه لەسەر مینبەر خەڵکی بەو شێوازە فێرە تەحیات دەکرد (السلام عليك أيها النبي..)

پاشان سەلام دەدەیتەوە.

سەلام دانەوە بۆ لای ڕاست روکنە وە بۆ لای چەپ سونەتە؛

به سلام دانەوەش کۆتایی بە نوێژەکەت دێت

شێوازی سەلام دانەوە:

ڕووی سەرت بە تەواوی دەبەیت بۆ لای ڕاست وە دەڵێیت:

﴿السلام عليكم و رحمة الله﴾

پاشان ڕووی سەرت بە تەواوی دەبەیت بۆ لای چەپ و دەڵێیت:

﴿السلام عليكم و رحمة الله﴾

کە پێغەمبەر ﷺ سەلامی دەدایەوە, ئەوەندە زۆر سەری دەسووڕاند بە لای ڕاست و چەپدا تاکو صەحابەکان سپیاتی ڕوومەتی پێغەمبەریان ﷺ بۆ دەردەکەوت.

ئەو شێوازە سەلامدانەوانەی کە لە سونەتی پێغەمبەر ﷺ هاتووە:

| ز | لای ڕاست | لای چەپ |
|---|---|---|
| 1 | تەنها سەلامدانەوە بە لای ڕاست بە ووتنی: "السلام عليكم" | سەلام نەدرێتەوە بە لای چەپدا |
| 2 | السلام عليكم و رحمة الله | السلام عليكم |
| 3 | السلام عليكم و رحمة الله | السلام عليكم و رحمة الله |
| 4 | السلام عليكم و رحمة الله وبركاته | السلام عليكم و رحمة الله |
| 5 | السلام عليكم و رحمة الله وبركاته | السلام عليكم و رحمة الله وبركاته |

شێوازە هەڵەکان لە سەلام دانەوە

بەرزکردنەوەی دەست





❌ کەم هاوەڕدانەوە

❌ هاوەڕدانەوە بە سینگ و سەر

- خواردن و خواردنەوە بە ئەنقەست؛
- ئاخاوتن و قسەكردنی بە ئەنقەست؛
- جوله و حەرەكەی زۆر كە دەبێتە هۆی ئەوەی كەسی نوێژكەر لە شێواز و هەیئەی نوێژ دەربچێت؛
- ئەنجام نەدانی واجبێك یان روكنێك بە ئەنقەست؛
- پێكەنین لە ناو نوێژ؛
- نەمانی دەستنوێژ یان بیرت بكەوێتەوە كە دەستنوێژت نەبووە؛
- لادانێكی زۆر لە قیبلە؛

1. [أستَغْفِرُ الله, أستَغْفِرُ الله, أستَغْفِرُ الله,

پاشان: اللهُمَّ أَنْتَ السَّلامُ وَمِنْكَ السَّلامُ، تَبارَكْتَ ياذا الْجَلالِ وَالْإِكْرام]؛

2. [لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ, لاَ حَوْلَ وَلاَ قُوَّةَ إِلاَّ بِاللَّهِ, لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَلاَ نَعْبُدُ إِلاَّ إِيَّاهُ, لَهُ النِّعْمَةُ, وَلَهُ الْفَضْلُ, وَلَهُ الثَّنَاءُ الْحَسَنُ, لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ]؛

3. [لا إلهَ إلا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، اللهُمَّ لا مَانِعَ لِمَا أَعْطَيْتَ وَلا مُعْطِيَ لِمَا مَنَعْتَ، وَلا يَنْفَعُ ذَا الْجَدِّ مِنْكَ الْجَدِ].

4. خوێندنی ئایەتی (255) (آية الكرسي) لە سورەتی البقره؛

5. [سُبْحَانَ الله (33 جار), الحَمْدُ لله (33 جار), اللهُ أَكْبَرُ (33 جار)

کۆی گشتی دەکاتە (99) بۆ تەواوکردنی (100) دەڵێت:

[لا إلهَ إلا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ]

6. خوێندنی سورەتەکانی:

﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ﴾ و ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ﴾

7. [ربِّ قِنِي عذابَك يومَ تَبْعَثُ عِبادَك]

8. [اللهمَّ أعنِّي على ذِكرِكَ وشُكرِكَ وحُسْنِ عِبادتِكَ ]

9. دوای نوێژی بەیانی و مەغریب (دوای سەلام دانەوە هێشتا ڕووت لە قیبلەیە وپێش ئەوەی هیچ قسەیەك بكەی یان لە شوێنی خۆت بجوڵێی): (10 جار) دەڵێی:

[لا إلهَ إلا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، يُحيِي ويُميت, وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ].

10. دوای نوێژی بەیانی:

[اللَّهمَّ إنِّي أسأَلُك عِلمًا نافعًا، ورِزْقًا طيِّبًا، وعمَلًا مُتقبَّلًا]

تێبینی: 1. تەنها زیکری (9) و (1) سونەتە ڕاستەوخۆ لە دوای سەلامدانەوە بخوێندرێت, زیکرەکانی دیکە پێش و پاش تێیدا ئاساییە؛

2. ئەو زیکرانە بە شێوەی کۆمەڵ و جەماعی ناخوێندرێت؛

بەڵکو هەر کەسێك بۆ خۆی دەخوێنێت وە سونەتە هەرکەسێك بۆخۆی تۆزەك دەنگی بەرز بکاتەوە.

1. سُبْحَانَ اللهِ ( 33 جار)، الْحَمْدُ لِلهِ ( 33 جار)، اللهُ أَكْبَرُ ( 33 جار)

کۆی گشتی دەکاتە ( 99 ) بۆ تەواوکردنی ( 100 ) دەڵێیت:

[لا إِلَهَ إِلا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ].

2. سُبْحَانَ اللهِ ( 33 جار)، الْحَمْدُ لِلهِ ( 33 جار)، اللهُ أَكْبَرُ ( 34 جار)

3. سُبْحَانَ اللهِ ( 33 جار)، الْحَمْدُ لِلهِ ( 33 جار)، اللهُ أَكْبَرُ ( 33 جار)

4. سُبْحَانَ اللهِ ( 25 جار)، الْحَمْدُ لِلهِ ( 25 جار)

اللهُ أَكْبَرُ ( 25 جار)، لا إله إلا الله ( 25 جار)

5. سُبْحَانَ اللهِ ( 10 جار)، الْحَمْدُ لِلهِ ( 10 جار)، اللهُ أَكْبَرُ ( 10 جار)

6. سُبْحَانَ اللهِ ( 11 جار)، الْحَمْدُ لِلهِ ( 11 جار)، اللهُ أَكْبَرُ ( 11 جار)

**تێبینی:** ئەو شێوازانەی لەسەرەوە باسکراوە هەمووی لە دوای یەك نوێژ ناگوترێت بەڵکو تەنها یەکێك لەوانە دەگوترێت بەڵام باشتر وایە هەر جارێك شێوازێك بگوترێت بۆ ئەوەی:

1. سونەتی پێغەمبەر ﷺ جێبەجێبکەین؛

2. بیرمان لە لای زیکرکردنەکە بێت وە بزانین چی دەڵێین.

## زیکری پێش دەستنوێژگرتن :

# بِسْمِ اللّٰه

## زیکری دواى دەستنوێژگرتن :

- أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا اللَّهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ
- اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنْ التَّوَّابِينَ ، وَاجْعَلْنِي مِنْ الْمُتَطَهِّرِينَ
- سُبْحانَكَ اللَّهُمَّ وبِحَمْدِكَ، أشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلاَّ أنْتَ، أسْتَغْفِرُكَ وأتُوبُ إِلَيْكَ.

**پاداشتی نوێژی سونەت لە ماڵ زیاترە لە مزگەوت**

- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: ((نوێژ لەماڵەکانتان ئەنجام بدەن, باشترین و بە خێرترین نوێژی مرۆڤ ئەو نوێژەیە کە لە ماڵەوە ئەنجام دەدرێت تەنها نوێژە فەرزەکان نەبێت))1؛
- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: ((نوێژکردنی مرۆڤ لە ماڵی خۆی خێرترە و باشترە لە نوێژکردن لە مزگەوتی من تەنها نوێژە فەرزەکان نەبێت))2؛

**ئەو فەرموودانەی دەربارەی نوێژە سونەتەکانی پێش و پاش نوێژی فەرز هاتووە:**

- پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت:- ((هەر کەسێك لە شەو و ڕۆژێکدا 12ڕکاعەت نوێژ بکات, ئەوا خانوویەکی لە بەهەشت بۆ ئاوەدان دەکرێت: 4 پێش نوێژی نیوەڕۆ, 2 پاش نوێژی نیوەڕۆ, 2 پاش نوێژی مەغریب, 2 پاش نوێژی عیشا, 2 پێش نوێژی بەیانی))3؛
- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: ((لەنێوان هەر بانگ و قامەتێکدا دوو ڕکاعەت نوێژی سونەت هەیە))4؛
- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: ((هەردوو ڕکاعەتی پێش نوێژی بەیانی باشتر و بەقیمەترە لە دونیا و ئەوەی لەناو دونیادا هەیە))5؛
- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: ((هەر کەسێك پێش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکاعەت نوێژ ئەنجام بدات وە پاش نوێژی نیوەڕۆ چوار ڕکاعەت ئەنجام بدات, ئەوا خوای گەورە لە ئاگری دۆزەخ دەیپارێزێت))6؛
- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: ((ڕەحمەتی خوای گەورە لەو کەسە بێت کە پێش نوێژی عەسر چوار ڕکاعەت نوێژ ئەنجام دەدات))7؛
- ((پێغەمبەر ﷺ بەردەوام دوو ڕکاعەت پێش نوێژی بەیانی و دوو ڕکاعەت دوای نوێژی عەسر ئەنجام دەدا))8؛
- عائیشە رَضِيَ اللهُ عَنْهَا دەفەرموویێت: ((دوو ڕکاعەت هەن پێغەمبەر ﷺ هیچ کات نە بە نهێنی و نە بە ئاشکرا وازی لێ نەهێناوە, دوو ڕکاعەت پێش نوێژی بەیانی و دوو ڕکاعەت دوای نوێژی عەسر))9.

**تێبینی:** ئەو دوو ڕکاعەتەی دوای نوێژی عەسر پێویستە دوای نوێژی عەسر ئەنجام بدرێت و تاخیر نەکرێت پێش ئەوەی ڕۆژ زەرد ببێت بەرەو ئاوا بوون و زەعیف بوون بڕوات.

---

1. البخاري (6113) و مسلم (781), 2. صحيح سنن أبي داود (1044), 3. صحيح الترمذي (415),
4. البخاري (627) و مسلم (838), 5. مسلم (725), 6. صحيح سنن أبي داود (1130),
7. صحيح سنن أبي داود (1271), 8. الصحيحة (2920), 9. البخاري (592) و إرواء الغليل (188/2)

به کۆکردنەوەی هەموو بەڵگەکان لەسەر سونەتەکانی پێش وپاش نوێژە فەرزەکان ئەم خشتەی خوارەوەمان بۆ دەردەکەوێت:

| پێش | نوێژ | پاش |
|---|---|---|
| 2 | بەیانی | - |
| 2+2 | نیوەڕۆ | 2+2 |
| 2+2 | عەسر | 2<br>پێویستە دوای نوێژی عەسر ئە نجام بدرێت و تاخیر نەکرێت پێش ئەوەی ڕۆژ زەرد ببێت بەرەو ئاوا بوون و زەعیف بوون بڕوات. |
| 2 | مەغریب | 2 |
| 2 | عیشا | 2 |

ئەم خشتەیە تایبەتە بەو فەرموودەی خوارەوە:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:- «هەر کەسێك لە شەو و ڕۆژێکدا 12 ركاعەت نوێژ بکات, ئەوا خانوویەکی لە بەهەشت بۆ ئاوەدان دەکرێت: 4 پێش نوێژی نیوەڕۆ, 2 پاش نوێژی نیوەڕۆ, 2 پاش نوێژی مەغریب, 2 پاش نوێژی عیشا, 2 پێش نوێژی بەیانی»

| پێش | نوێژ | پاش |
|---|---|---|
| 2 | بەیانی | – |
| 2 + 2 | نیوەڕۆ | 2 |
| – | عەسر | – |
| – | مەغریب | 2 |
| – | عیشا | 2 |

نوێژی جەنازە چوار تەکبیرەیە بەم شێوەی خوارەوە ئەنجام دەدرێت:

- لەدوای (الله أکبر)ـی چونە ناو نوێژ سورەتی (الفاتحة) و سورەتێکی دیکە دەخوێنێت
- پاشان دەڵێی (الله أکبر)
- پاشان صەڵاوات لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەدەیت بەم شێوەیە:

﴿اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وعلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كما صَلَّيْتَ علَى إبْرَاهِيمَ، وعلَى آلِ إبْرَاهِيمَ، إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ،
اللَّهُمَّ بَارِكْ علَى مُحَمَّدٍ وعلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كما بَارَكْتَ علَى إبْرَاهِيمَ، وعلَى آلِ إبْرَاهِيمَ إنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ﴾

- پاشان دەڵێی (الله أکبر)
- پاشان دوعا بۆ مردوو دەکەی بەو دوعایانەی کە لە سونەتی پێغەمبەر ﷺ هاتووە یان هەردوعایەك کە بیزانی؛
- پاشان دەڵێی (الله أکبر)
- پاشان دوعا بۆ مردوو دەکەی بەو دوعایانەی کە لە سونەتی پێغەمبەر ﷺ هاتووە یان هەردوعایەك کە بیزانی؛
- هەندێك لەو دوعایانەی لە سونەتی پێغەمبەر ﷺ دا هاتووە:

((اللَّهُمَّ اغفِرْ له وَارْحَمْهُ وَعافِهِ وَاعْفُ عنْه، وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ، وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ، وَاغْسِلْهُ بالمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ، وَنَقِّهِ مِنَ الخَطَايَا كما نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الأبْيَضَ مِنَ الدَّنَسِ، وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِن دَارِهِ، وَأَهْلًا خَيْرًا مِن أَهْلِهِ وَزَوْجًا خَيْرًا مِن زَوْجِهِ، وَأَدْخِلْهُ الجَنَّةَ وَأَعِذْهُ مِن عَذَابِ القَبْرِ، أَوْ مِن عَذَابِ النَّارِ))

((اللَّهُمَّ اغفر لحيِّنا وميِّتنا وصغيرِنا وكبيرِنا وذكَرِنا وأنثانا وشاهدنا وغائبنا اللَّهُمَّ مَن أحييتَه منَّا فأحيِهِ علَى الإيمانِ ومَن توفَّيتَه منَّا فتوفَّهُ على الإسلامِ اللَّهُمَّ لا تحرِمنا أجرَه ولا تُضلَّنا بعدَه))

- پاشان سەلام دەدەیتەوە؛
- سەلام دانەوە بە تەنها لە لای ڕاست دروستە وە سەلام دانەوە لەلای ڕاست و لای چەپ دروستە.

## نوێژی جەژن دوو ركاعەتە

- لە ركاعەتی یەكەم جگە لە (الله أكبر)ـی چونە ناو نوێژ حەفت جار دەڵێی (الله أكبر).
- پاشان سورەتی (الفاتحة) دەخوێنی پاشان هەندێك قورئان دەخوێنی پاشان دەچیتە ركوع و هەموو كردەوەكانی نوێژی ئاسایی ئەنجام دەدەی؛
- لە ركاعەتی دووەمدا, جگە لە (الله أكبر)ـی هەستانەوە, پێنج جار دەڵێی (الله أكبر)
- پاشان سورەتی (الفاتحة) دەخوێنی پاشان هەندێك قورئان دەخوێنی پاشان دەچیتە ركوع و هەموو كردەوەكانی نوێژی ئاسایی ئەنجام دەدەی وە تەحیات دەخوێنی سەلام دەدەیتەوە.
- سونەتە لە دوای سورەتی (الفاتحة), لە ركاعەتی یەكەم سورەتی (ق) وە لە ركاعەتی دووەم سورەتی (القمر) بخوێنیت؛
- یان لە دوای سورەتی (الفاتحة), لە ركاعەتی یەكەم سورەتی (الأعلى) وە لە ركاعەتی دووەم سورەتی (الغاشية) بخوێنی.
- تەكبیراتی ناو نوێژی جەژن سونەتە, ئەگەر ئەنجامیشی نەدەی نوێژەكەت بەتاڵ نابێتەوە.
- تێبینی: لە نێوان تەكبیراتەكان هیچ زیكرێك لە پێغەمبەر ﷺ نەهاتووە, بەڵام لە عبدالله كوڕی مسعود رضي الله عنه هاتووە كە لە نێوان تەكبیراتی جەژن زیكری كردووە وەكو (سبحان الله, الحمدلله, صەلاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ)
- بۆیە ئەگەر تەنها (الله أكبر) بڵێی بێ ئەوەی هیچ زیكر لە نێوانیان بكەی ئەوا جائیزە و هیچ كێشەی نیە, وە ئەگەر زیكریش بكەی وەكو (سبحان الله والحمدلله و الله أكبر, اللهم صل على محمد) ئەوا هیچ كێشەی نیە. والله أعلم.

- هیچ بەڵگەیەك نەهاتووە لە پێغەمبەر ﷺ كە دەستەكانی بەرزكردبێتەوە لەگەڵ تەكبیراتی نوێژی جەژن وە هیچ بەڵگەیەكی صحیح نەهاتووە كە صەحابەكان دەستیان بەرزكردبێتەوە.

## نوێژی خۆر گیران یان مانگ گیران دوو ركاعەتە

- هەر ركاعەتێك دوو ڕاوەستان و دوو ركوع و دوو سوجدەی تێدایە بەم شێوەی خوارەوە:
- دەچیتە ناو نوێژ بە ووتنی (الله أكبر)، پاشان سونەتە دوعای چوونە ناو نوێژ بخوێنی، پاشان سورەتی (الفاتحة) دەخوێنی پاشان دەست دەكەی بە قورئان خوێندن (سونەتە قورئان خوێندنەكەت درێژ بێت واتا زۆر قورئان بخوێنی)؛
- پاشان ركوعێكی درێژ دەبەیت كە نزیك بێت لە خوێندنی قورئانەكەت،
- پاشان هەڵدەستیتەوە لە ڕێ ی هەڵستانەوەت دەڵێ ی (سمع الله لمن حمده) وە كە ڕاست بوویەوە دەڵێ ی (ربنا لك الحمد)؛
- پاشان سورەتی (الفاتحة) دەخوێنیت پاشان دەست دەكەیتەوە بە خوێندنەوەی قورئان (سونەتە قورئان خوێندنەكەت درێژ بێت واتا زۆر قورئان بخوێنی بەڵام كورت تر بێت لە خوێندنەوەی یەكەم)؛
- پاشان ركوعێكی درێژ دەبەیت بەڵام لە ركوعی یەكەم كورت تر بێت؛
- پاشان هەڵدەستیتەوە وە لە ڕێ ی هەڵستانەوەت دەڵێ ی (سمع الله لمن حمده) وە كە ڕاست بوویەوە دەڵێ ی (ربنا لك الحمد)، وە ڕاوەستانێكی درێژ ڕادەوەستیت بێ ئەوەی قورئان تێدا بخوێنیت؛
- پاشان دەچیتە سوجدە وە سوجدەیەكی درێژ دەبەیت، پاشان هەڵدەستیتەوە وە لە نێوان هەردوو سوجدەدا بۆ ماوەیەكی درێژ دادەنیشیت، پاشان سوجدەیەكی دیكەی درێژ دەبەیت؛
- پاشان هەڵدەستیتەوە بۆ ركاعەتی دووەم؛
- هەمان كردەوەكانی ركاعەتی یەكەم ئەنجام دەدەیت لە هەردوو ڕاوەستان و خوێندنەوە و هەردوو ركوع و هەردوو سوجدە و دانیشتن لە نێوان هەردوو سوجدە بەڵام هەموو كردەوەكان ماوەیان كەمتر و كورت تر بێت لە كردەوەكانی ركاعەتی یەكەم.
- پاشان تەحیات دەخوێنی وە سەلام دەدەیتەوە.

- هەر کاتێك نیەتی شتێکت هێنا وە دوو دڵ بووی لە ئەنجام دانی جا چ لە کاروباری دونیا یان کاروباری دین بێت, ئەوا سونەتە دوو رکاعەت نوێژی ئیستیخارە بکەیت. کە واتاکەی ئەوەیە ئەو ئیشەی خۆت بەتەواوەتی دەخەیتە بەردەست خوای گەورە بۆ ئەوەی ئەگەر خێری تێدابوو بهێنێتە پێشت و بۆتی جێ بەجێ ببێ وە ئەگەر خێریشی تێدا نەبێت ئەوا خوای گەورە لێتی دوور بکاتەوە.
- پێغەمبەر ﷺ صەحابەکانی فێردەکرد کە نوێژی ئیستیخارە بۆ هەموو ئیش و کارێکی خۆیان ئەنجام بدەن هەروەکو چۆن سورەتێکی قورئانی فێری صەحابەکان دەکرد, وە دەیفەرموو ئەگەر یەکێك لە ئێوە ویستی هەبوو کارێك بکات ئەوا با **دوو رکاعەت نوێژی سونەت ئەنجام بدات** پاشان ئەو دوعایەش لە دوای نوێژەکە بکات:
- نوێژی ئیستیخارە بریتیە لە دوو رکاعەت وەکو نوێژی سونەتی ئاسایی بە نیەتی نوێژی ئیستیخارە:
- پاش تەواو بوونی نوێژەکە سەلام دەدەیتەوە و ئەم دوعایەی خوارەوە دەکەیت:

((اللَّهُمَّ إنِّي أَسْتَخِيرُكَ بعِلْمِكَ، وأَسْتَقْدِرُكَ بقُدْرَتِكَ، وأَسْأَلُكَ مِن فَضْلِكَ العَظِيمِ؛ فإنَّكَ تَقْدِرُ ولَا أقْدِرُ، وتَعْلَمُ ولَا أعْلَمُ، وأَنْتَ عَلَّامُ الغُيُوبِ، اللَّهُمَّ إنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أنَّ هذا الأمْرَ (**ناوی کارەکەی خۆت دەهێنی**) خَيْرٌ لي في دِينِي ومعاشِي وعَاقِبَةِ أمْرِي فَاقْدُرْهُ لي ويَسِّرْهُ لِي، ثُمَّ بَارِكْ لي فِيهِ، وإنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أنَّ هذا الأمْرَ (**ناوی کارەکەی خۆت دەهێنی**) شَرٌّ لي في دِينِي ومعاشِي وعَاقِبَةِ أمْرِي فَاصْرِفْهُ عَنِّي واصْرِفْنِي عنْه، واقْدُرْ لي الخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ أرْضِنِي))

- پێویستە هەموو کاروبارێکی خۆمان ڕادەستی خوای گەورە بکەین وە دڵنیابین لەوەی کە خوای گەورە ئەوەی باشە بۆمان دەهێنێت پاش ئەنجام دانی نوێژی ئیستیخارە بەرەو ئەو کارە برۆ کە دەتەوێت ئەنجامی بدەیت پێویست بەوە ناکات کە خەون ببینی یان شتی زەقت بۆ دەربکەوێ کە ئەو کارە باشە بەڵکو بەردەوام بە ئەگەر خێری تێدابوو ئەوا خوای گەورە بۆتی ئاسان دەکات ئەگەر نا لێتی دوور دەکاتەوە.

دروستە نوێژی ئیستیخارە دووبارە بکەیتەوە بۆ هەمان ئیش و کار.

- نوێژی جەماعەت واجبە لەسەر ئەو پیاوانەی کە گوێیان لە بانگ دەبێت
- نوێژی جەماعەت فەزل و پاداشتی زۆری هەیە

ئەمانەی خوارەوە هەندێکن لەو فەزل و پاداشتانە:

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت:

- (( هەرکەسێك دەستنوێژێکی جوانی گرت و بەرەو نوێژێکی فەرز ڕۆیشت، لەگەڵ ئیمام نوێژی ئەنجامدا ئەوا خوای گەورە لە هەموو گوناحەکانی خۆش دەبێت ))؛
- (( نوێژی جەماعەت پلە و پاداشتی بە بیست و حەفت پلە زیاترە لە نوێژی بە تاك ))؛
- (( هەر کەسێك لە تاریکایی شەودا بەرەو مزگەوتەکان بڕوات ئەوا ئەو کەسە لە ڕۆژی قیامەت بە ڕووناکیەوە دەگاتە خوای گەورە ))؛
- (( هەر کەسێك لە ماڵەوە خۆی پاك کردەوە و دەستنوێژی گرت، پاشان بەرەو ماڵێك لە ماڵەکانی خوای گەورە ڕۆیشت بۆ ئەنجامدانی نوێژێکی فەرز ئەوا بۆ هەموو هەنگاوهاوێشتنەکانی، هەنگاوێکیان گوناحێکی پێ دەسڕێتەوە وە هەنگاوەکەی تریان پلەیەك بەرزدەبێتەوە ))؛
- (( هەرکەسێك نوێژی عیشا بە جەماعەت ئەنجام بدات ئەوا وەکو ئەوە وایە بە قەدەر نیوەی ئەو شەوە هەڵستابێتەوە و شەو نوێژی و عیبادەتی کردبێت، وە هەر کەسێك نوێژی بەیانی بە جەماعەت ئەنجام بدات ئەوا وەکو ئەوە وایە ئەو شەوە هەمووی هەڵستابێتەوە و شەو نوێژی و عیبادەتی کردبێت )).

ـ کۆتایی ئەم کتێبە ـ

الحمدلله الذي بنعمته تتم الصالحات

اللهم صل وسلم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين

ئەم کتێبە لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان
ژمارەی سپاردنی ( 171 ) ساڵی ( 2021 )ـی پێدراوە



بۆ داواکردنی ئەم کتێبە بە شێوەی PDF تکایە پەیوەندی بەو ژمارە یان ئیمێڵەی خوارەوە بکە ,
یان ئەم بارکۆدەی خوارەوە سکان بکە

هەر کەسێك هەڵەیەکی بینی لەم کتێبە تکایە ئاگادارمان بکاتەوە لەسەر ئەم ژمارەی خوارەوە.

ئیمێڵ : muhammadblackstone@gmail.com

ژمارەی مۆبایل : 07508121914

پەڕەی فەیس بووك : زانستی ڕاست العلم الصحیح

زانستي راست zanstirast1439

کەناڵی تیلیگرام: https://t.me/zanstirast1439

چاپی سێیەم: 1000 دانە

تشرینی دووەم 2021

ربیع الثاني 1443

